کۆمەڵێک لە شیعر و وتەکانی
مەولانا جەلالەددینی بەڵخی ڕۆمی

# گوڵزاری ڕۆمی



جگە لە خەم، کەسی تر منی لەیاد نییە!

تۆ

ئەی گەشتیارەکە...

بۆ کوێ خۆت ئامادە دەکەیت؟ بەرەو کوێ؟

غەمگینیت لە دابڕان

وەك غەمگینی ماسیە لە دابڕانی دەریا!

بۆیە لێوە وشکەکانت،

دوری لێ هەڵدەوەرێت!





عاشق

خودا، بەدرێژای ساڵ

سەر خۆش و

ڕیسوای کردوە !





عیشق !
ئاوی حەیاتە
بچۆرە نێوی
هەر دڵۆپێکی ئەم ئاوە
دەریای ژیانێکی سەربەخۆیە !





ئەی دڵبەر
ئێمە لەمەحەببەت، نزیکی تۆین!
لەهەر شوێنێ پێت دابنێی...
دەبینە (خاك)ی تۆ!
چۆن دەبێت لە مەزەبی عیشق
دونیا بە تۆوە ببینین و، خۆشت نەبینین!

٤



بۆ ماوەیەك
چاولێکەریم بۆ (خۆم) هەڵبژارد
گوێم لە ناوم دەبوو و، خۆم نەدەدیت
سەرقاڵ بووم بە (خۆم)
کە من شایتەی (خۆم)نەبووم
کاتێ لە (خۆم) دەرچووم
(خۆم) دۆزیەوە





عیشق

ڕێگە و ڕێبازی  پەیامبەرانە !

ئێمە ڕۆڵەی (عیشق)ین و

عیشق دایکمانە !





مەڕۆ
خۆ ئەگەر هەر دەشڕۆیت
هانێ (فەرموو) ڕۆحی من بەرە!

٧



هەرچەندە (مەعشوق)
لەئاست ژانەکانما،
بێ دەنگە!
وەلێ لەم بێ دەنگییەی
سەد وەڵامی تێدایە وەڵام!

٨



هەرکەسێ

جوانی (دڵبەر) میحرابی بێت

ئەوە سەد جۆر

لە نوێژ و،

ڕکووع و،

کڕنووشی هەیە!

٩



من نەهاتومەتە ئەم دونیایە
تەنیا بۆ دۆزینەوەی
ڕێگەی گەڕانەوە بۆ لای دڵبەر
نەبێت.

١٠



## له عیشقی هەقیقی
## نە (وەفا) هەیە
## نە (جەفا) !

١١



ئەو زانستەی لە خوێندنگەکان فێری بووین

شتێکەو،

(عیشق)یش شتێکی تر.





بگری!

چونکێ: گریان ،

سەرمایەی عیشقە!

١٣



حاشا!

ئەگەر چاکتر هەبێت،

لەتەماشاکردنی ڕوخسارت

١٤



جگە لە خەم

کەسی تر،

منی لەیاد نییە!

١٥



له عیشقی تۆدا،

عەقڵ خەوتووە!

١٦



ئێمە لەدونیادا لە گەشتێکدا دەڕۆین

کەچی وا ئەزانین ئەو دنیایە ئەڕوات!





دڵت لەهەموو وێنەیەك خاڵی بکە
تا وێنەیەکی وات بۆ دێت،
کەوێنەی نەبێت!

١٨



من هەرگیز یادی ناکەمەوە
چون ئەوەی یادی لێ دەکرێتەوە
غائیبە نەك حازر!

١٩



# عیشق زەریاکان وەك قۆری (کتری)

# دەکوڵێنێت و

# کێوەکانیش دەکاتە لم

# ٢١



له ده‌روێشێکیان پرسی؛

دڵت چی ده‌وێت؟

گوتی:

ئه‌وه‌(دڵم هیچی نه‌وێت)

٢٢



# هاودڵی
# له هاوزوبانی بەرزتره

٢٣



# ئادەم عاشقە و

# ئیبلیس: نموونەی باڵای زیرەکی و بینین و زانینە

٢٤



گوێ بگرە ئەگەر توانای بیستننت هەیە

پێوەندیی بە دڵبەر

یانی پچڕان لە نەفست

٢٥



گوێ بگرە ئەگەر توانای بیستننت هەیە

پێوەندیی بە دڵبەر

یانی: پچڕان لە نەفست

٢٦



گوتم؛

دڵم ماچێکی تۆی دەوێت

گوتی؛

نرخی ماچێك، دەرچوونی گیانتە!





ئەو بێ شوێنە
وەلێ لەهەموو شوێنێك
لەگەڵتە

٣٠



نا...نەکەیت بڕۆیت!
خۆ ئەگەر هەر دەڕۆیت،
هانێ ڕۆح و گیانم لەگەڵ خۆت بەرە!

٣١



کاتێ گەشت بۆلای تۆ دەکەم
لە نەفسی خۆم گەشت دەکەم
بەڵام کە دەگەڕێمەوە
هەرگیز خۆم نادۆزمەوە خۆم!

٣٢



بیزانە
گەورەیی عاشقان
لە گەورەیی ئەوەیە
کە عاشقی دەبن





وەهابە کە دەردەکەویت

دەرکەویت کە وەهایت





سەردەمێك دێت

هیچ شتێ تێدا مانای نامێنێت

جگە لە(خۆدانە دەست)ی ئەم عیشقە

٣٥



خۆشەویستی

لە ئێرادەی ئازادی خۆتەوە دێت

ناتوانی لە هیچ

قوتابخانەیەك فێری بیت





گوتی:

چاوەکانت مانگیان دیوە؟

گوتم؛

مانگ پرسیاری (مانگ)ی کرد؟

٣٧



ئەو عیشقەی لەسەر بنەمای ڕوخسار و ڕەنگە

لەڕاستیدا، ئەوە عیشق نییە!

تەنێ ناتەواوییە و نەنگە





شەریعەت زانستە

تەریقەت کردارە

حەقیقەت گەیشتنە بە مەعشووق





ئامانج لە نوێژکردن ئەوەیە:
خەمی دابڕانتم بۆ باس بکەم
دەردە دڵی خۆمت بۆ بکەم
وەگەرنا
ئەوە چ نوێژێکە کە ڕووم لە تۆ بێت و
دڵم لەبازاڕ بێت؟!





بیسەر بە، بە گوێی لێبووردەیی
بینەر بە، بە چاوی میهرەبانی
بێژەر بە، بە زمانی عیشق

٤١



له خەرابات

فیز و لوتبەرزی ناکرێت

ئەوەی لەم شوێنەدا

دەکرێت

(پیاوەتی)یە

٤٢



نزمترین و خراپترین مەرگ،

مردنێکی بێ عیشقە!





یار لەمن زێدەتر لەخۆمەوە نزیکە
لەوە سەر سوڕهێنەرتر ئەوەیە
کە من لەو دوورم!

٤٤



هەموو شتێك تا بیدۆزیتەوە

دەبێت بۆی بگەڕێیت

جگە لە یار نەبێت

کە دۆزیتەوە، بۆی دەگەڕێیت!

٤٥



به تۆوە دڵ خۆشم،

بەبێ هیچ هۆکارێك!

٤٦



خاك و خۆڵ
دڵ خۆش و بەختەوەر
بە شەقاوی قاچەکانت!

٤٧



جوانی (دڵبەر)

دڵبەر نوێ دەکاتەوە

وەك كۆمەڵگەی گوڵان لە بەهاردا





# ئەی ڕۆڵە:

# عیشق کاری پاڵەوانەکانە!

## ٤٩



وتم هەندێك لەو (مەست) بوونەتم پێ نادەی؟

وتی: نا..!

نەیزانی کە ئەم (نا)یەی ، مەست بوونە!

٥٠



دەڵێن: (فیتنە خەوتنی چاکترە)
وەلێ تۆ خۆت فیتنەیت،
بەخەبەر بیت چاکترە.





ئەی دڵ
بۆ چەند شەوێك مەخەوە
تا سەحەر مەخەوە
لە فیراقی (ڕۆژ)دا
وەك(مانگ) مەخەوە

٥٢



جوانیی و بەهرەوەری پیاو
بە هەند وەرمەگرە
بەڵکو سەیری
پەیمان و وەفای پیاو بکە!





دەشێت مرۆڤ
گرفتاری تاڵی دڵبەر، وەك (شەکر) بخوات
دڵبەر سوێرە ، فرە سوێرە
لە کاتێ (خوێ) هەبوو
خواردنی (جگەر)یش دەشێت

٥٤



هەموویان لەوەرزی بەهاردا
خەریکی بەرهەم هێنانن
دواجار لە پایزدا
بەناچاری هەڵی دەوەرێنن
ئەوە تەنێ عیشقی تۆیە
کە هیچ وەرزێکی بۆ نییە!





ئاو ئەگەر لەنێو کەشتی بێت
یانی لەنێوچوونی
بەڵام کاتێ لە ژێریەتی
یانی ڕزگار بوونی
ت/ ئاو: دنیایە ، کەشتی :دڵی مرۆڤ

٥٦



عاشقان

سەد ساڵ لە تەنەن
پێشکەشی یەك سات دەکەن
لە پێناو بۆنی هەناسەکان
هەزار ماڵ دەبڕن لە پێناو دڵ
هەزار ڕۆح پێشکەش دەکەن.

٥٧



به تەنێ مەڕۆ

چونکە ڕێگر زۆرن

تۆش یەك ڕۆحت هەیە و

دووژمنەکانی ڕۆح زۆرن

ئەتۆ دوژمنی ڕۆح

بە مەعشووق و مەحبووب ناوزەد دەکەیت

گەوجی وەك تۆ

زۆرن لەم دنیایەدا.





خۆشی زەمانە
لەغەمی من دەستەوسان بوو
هەموو دەرمانێکیش
دەوستەوسانی من بووم
تەنێ غەمی دڵبەر نەبێت.





من چیم؟
جگە شوێنکەوتەیەك ئەی مامۆستا
من چیم؟
جگە لە منداڵێك لە بەردەمتا ئەی عیشق!





ئافرەت لە نووری خودایە
ئەو هەر دڵبەر و دروستکەر نییە
بەڵکوو درووستکاریشە!





ئەوەی ستایشی مرۆڤ دەکات
ستایشی خۆیی کردووە
ئەوەی ستایشی خۆر دەکات
ئەوا ستایشی چاوی خۆی کردووە.

٦٢



لێگەڕێ با بۆخۆیان بڵێن عاشق شێتە!
نازانن کە شێتیەکی جوانە
دەردێکی خۆشە
تەنیا چارەش بۆ ئەو شێتییە
دیدار و سەردان و بینینی یارە!

٦٣



ئەی عیشق تۆ لای خەڵك
زۆر ناو شۆرەتت هەیە
بەڵام من دوێنێ شەو
ناوێکی ترم لێ نایت
دەردی بێ دەرمان!





لەو ڕۆژەی ئەفلاکت تێیدا داڕشت
ئەنگوستیلەی زێڕین بۆ عاشقان
بە ڕەنگێکی تر بۆیە کرا،
لەڕێگەی عیشقدا لەسەر چۆنێتیی
بۆیە کردنەکەی مەترسە
چونکێ ئەم زێڕە لە دەرەوەی
مەملەکەتی عەقڵ لەقاڵب دراوە.





شوێنێك
له دەرەوەی جیهانی کوفر و ئیماندا هەیە!
لەنێوەڕاستی ئەم شوێنەدا،
ئێمە (عیشق)مان هەیە.





لەم ڕێگایە

جگە لە "دڵ"ت

هیچی تر مەکە

بەچاوساغ و ڕێبەرت





ئەو چاوانەی کە دەبینێت، نازانێت
چونکە لەسەر کوڵمەت
هەزار ڕەقیب هەیە.

٦٨



لاشەی تۆ وەك ئاشی ئاوە!

ئاوی ئەم ئاشە عیشقە

کە کاتێ ئاو نەبێت

ئاش چۆن دەسوڕێت؟!





ئەم تەنیاییە لە هەزار ڕۆح چاکترە
ئەم ئازادییە لە موڵکی دنیا چاکترە،
یەك سات خەڵوەت لەگەڵ حەق
لە ڕۆح و دنیا و لەمەو لەوەش چاکترە!

٧٠



زاهیدان لە ترسەوە بە پێ

ڕادەکەن بۆ لای خودا

هەرچی عاریفانن بە پاڵ دەفڕن

خێراتر لە تیشك و با!

٧١



ئەو مەلیکەی

تۆزی بەر پای، تاجی سەروانە

پێیم گوت: فیراقت لە مردن

لە سەرم بەهێزترە!

ئێستەش ها ڕەنگ زەردیم بەڵگەیە!





خۆر چییە تا بگات بە ڕوخسارت
"با"ی بێ بەها چیە تا بگات بە قژەکانت
ئەو ئەقڵەی میرێتی شاری وجوود دەکات
شێت دەبێت تا دەگاتە لات!

٧٣



عیشقەکەت
لەهیچ جێگەیەك جێی نەبووەوە
تەنێ لە دڵم نەبێ!
ئێستا لەوێش جێی نابێتەوە
بە چاوما دێتە خوارەوە!





ئەو ساتەی عەقڵ ململانێی دڵ دەکات
ڕۆحم بە پێخاوسی لەم جەنگەدا ڕادەکات
شێتە ئەوەی لە عاقڵان ئەژمارم بکات و
ئاقڵە ئەوەی لێم ڕابکات.

٧٥



چیرۆکی خودی عیشق تەنێ لە خودی عیشق
گوێی لێ ڕادەگیرێت
عیشق وەك ئاوێنەیەکی پاژە
هەموو وردەکارییەك بە بێدەنگی
دەگوازێتەوە.

٧٦



عاشق نه موسوڵمانه نه مەسیحی
یان بەشێك بێت لە هەر عەقیدەیەك
دینی عیشق هیچ مەزهەبێکی نییە
تا باوەڕی پێ بهێنیت یان
باوەڕی پێ نەهێنیت.





هاوەڵانم نە بەدڵ نە بە عەقڵ خۆشناوێن
دەگونجێت دڵ بوەستێت
عەقڵ بیری بچێتەوە
هاوەڵانم بە ڕۆح خۆشدەوێت
ڕۆح نە دەوەستێ ... نە بیریشی دەچێتەوە!





ئەی دڵبەر
ئێمە بەندی داوی خۆشەویستی تۆین
لەهەر کات و شوێنێك قاچەکانت دا دانێیت
ڕۆحی ئێمە بۆ تۆ خاکە
دەی چۆن دەشێت لە مەزەبی عیشقدا
جیهان بە تۆوە ببینین و
خۆت نەبینین.؟!





ئەو مانگەی کە نە لە ئاسمانە و نە لە ڕێسمان
لە کوێیە؟
مەڵێ لێرەیە و لەوێیە
ڕاستگۆیانە پێم بڵێ: لە کوێیە ئەو؟
نا، سەراپا ئەوە
بەڵام کوا ئەو بینەرە؟!





له خۆشەویستی گەڕێ
چیت لێدەکات با لێتبکات
لێگەڕێ با بتسووتێنێت
لێگەڕێ با بوونت بکاتە خاك و گڵ
لە ناخی ئەم گڵەدا، گوڵ شین دەبێت.





گوتت: تۆ چۆنی؟
من هەرچۆنێك بم عیشق لەسەر سەرمە و
سەریشم لەسەر دەستە
شتێ بەدەوری سەرما دەخولێتەوە
ناتوانیت ناوزەدی بکەی
وەلێ لە لوتکەی جوانییە!





ئا، وەك بڵێی هەقیقەت "ئاوێنە"یەك بوو
به دەست خوداوە
کاتێك ئەم ئاوێنەیە کەوتە خوارەوە هەقیقەت شکا،
لەم کاتەدا هەر یەکێك دەهات و پارچەیەکی لەم شکاوە
هەڵدەگرت و بە دیارییەوە دەیگوت:
هەقیقەت تەنێ هەر ئەوەیە!





مەرگی هەر کەسێك ڕەنگی خۆیەتی
مەرگ بۆ دوژمن دوژمنە و،
بۆ دۆست دۆستە
ئەگەر لە مەرگ دەترسیت و لە دەستی هەڵدێیت
ئاگادار و هۆشیار بە
چونکە تۆ لە دەست خۆت هەڵدێیت!





به کاریگەری ئاوی حەیاتی دڵبەر
هیچ نەخۆشییەك نەما
بە کاریگەری هێزی دڵی ویساڵی دڵبەر
هیچ دڕکێك نەما
دەڵێن: پەنجەرەیەك لە دڵەوە بۆ دڵ هەیە
چ پەنجەرەیەکە؟ کە دیوار نامێنێت!





دادگەر بە، عیشق کارێکی باشە
ئەگەر تەنگییەك هەبێت، بەهۆی ئاکارەوەیە
تۆ شەهوەتت بە "عیشق" نێوزەد دەکەی
لە شەهوەتەوە بۆ عیشق
ڕێگەیەکی دوور هەیە!





ئەو شوێبەی مەعشوقی وەك تۆی لێیە
کوفرە ئەگەر شوێنێك بێت بو قەرارگرتن
ئەو ئەقڵەی تۆ دەبینێت و حەیران نابێت
بۆ وی چاکترە، بە داران بکوترێ
چونکێ مارێکی قیزەونە ێەم ئەقڵە.





گەرمی تەنێ لە ئاگرێکی شوعلەدار نییە
ئەگەر لەناکاو هاتیتە ژورەوە
ئا ئەوەیە گەرمی
ساردی تەنێ لە زستانێکی سەختدا نییە
کاتێك کفتی هاتن دەدەیت و نایەیت
ئا ئەوەیە ساردی!



بۆنی هەناسەی ئەهلی ئیقبال
خۆشە وەکو گوڵ
وەلێ شەوقی هەناسەی وەکو دڕکە
تیژ و سەر سەخت
بە هاوەڵێتی گوڵ دڕك لە ئاگر ڕزگاری دەبێت
بە هاوەڵێتی دڕك گوڵ دەکەوێتە نێو ئاگرەوە





مەعشووق زەریفە، ئەمەش تاوانیەتی
جوان و بێگەردە، ئەمەش سوچییەتی!
دواجار بە چ بەهانەیەك لێی ڕادەکەیت؟
ئەو لە نەنگیی خاڵییە، ئا ئەمەش سوچیەتی!

٩٠



ئەگەر مەعشووق توێکڵم هەڵ بدڕێت و شەقم بکات
هاوار ناکەم و ناڵێم ئەم ئازارە لەویەوە
خەڵکی هەموو دووژمنی ئێمەن
لەلای دووژمنان گلەیی لە دڵبەر بکەی
جوان نییە!





ئەی ئەو کەسەی لە "کرۆك" بێ ئاگایت و
بە توێکڵ فریو دراوی
بەئاگابی، لە نێوەڕاستی ڕۆحت دڵ هەیە
هۆش کرۆکی لاشەتە
کرۆکی هۆشت ڕۆحە!





ئەگەر تۆ بۆ ساتێك چەسپاویت لەسەر عیشقدا هەیە
ئیدی چ کارەیت لە ڕیزی عاشقاندا؟
سەرتیژ بە وەك دڕك
بۆ ئەوەی دڵبەر وەك دڕك
جارێك لە سینەت و جارێك لە تەكدا بێت.





گیانەکەم غەمی تۆ لە هەموو ئەوانەی دەیڵێیت خراپترە
خەمت ئازاری دڵ و، سوتێنەری جەرگ جەستەیە
هەر شتێك کە دەیخۆیت کەم دەکات
تەنێ غەمت بەبێت هەر جارێك کە دەی خۆم زیاد دەکات!





مادام لەگەڵ تۆم
من لەپێکگەیشتن و هاوەڵیتدا ناخەوم،
مادام دوورم لە تۆ
من لە دووری و پشوی تۆدا ناخەوم
پاك و بێگەردی بۆ خودا
من هەردوو شەوەکە بەخەوەرم
سەیری جیاوازی نیوان، جۆرەکانی بێداری دەکەم!





عەقڵ هاتوو دەستی کرد بە ئامۆژگاری عاشقان
لە ڕێگادا دانیشت و ڕێگە برینی کردە ئاینی
کاتێ هیچ شوێنێکی لە سەریان بۆ ئامۆژگاری نەدۆزیەوە
قاچەکانی ماچ کرد و گەڕایەوە شوێنی خۆی!

٩٦

